دیاری‌یه بۆ لاوانی کورد:

# لەگەشتی پێنجوین



لە ساڵی ۱۹۳۰ دا



[وێنەی نووسەر لە ساڵی ۱۹۳۰دا]

نووسینی :
شاکر فتاح

لە زنجیرە نووسراوانی « گەشت و گوزار » . ژمارە : ۳
۱۹۷۳

دیاری‌یە بۆ لاوانی کورد:

# گەشتی پێنجوین

## لە ساڵی ١٩٣٠ دا



[وێنەی نووسەر لە ساڵی ١٩٣٠دا]

نووسینی :

شاکر فتاح

لە ڕیزە نووسراوانی « گەشت و گوزار » . ژمارە : ٣

١٩٧٣

# ئەم نووسراوە

لاوی کوردی خۆشەویست !

نووسەر ، لە سالی ١٩٣٠ دا ئەم [ گەشت نامە ] یەی نووسیوەتەوە ـ ئەو دەمە لاوێك بووە ، لە تەمەنی حەڤدە سـالی دا . ئەو دەمە بۆ ئۆتۆمۆبێل ، ڕێگا نەبوە ، پێی بچێتە [ پێنجوێن ] . بە سواری ئەسپ چووە ، هەروەها لە [ پێنجوێن ] دا نە پڕۆژەی ئاو هەبوە ، نە پڕۆژەی ئەلەکتریك ، نە خوێندنگا ، نە ماکینەکانی کشتوکال ... گوندێکی پاشکەوتووی بچوك بووە . [ شێخ محمودی گەورە ] کە چەند سالێك بوو ، تەختی خونکار [ ملك ] ی لە دەست چووبوو ، بە ئاوارەیی ، لە گوندی [پێران] دا ، نزیك بە سنووری [ئێران] ، دائەنیشت . لەو سەردەمەدا چ بازرگانی ، چ کشت و کال ، چ خوێندەواری لە شێوەیەکی کۆن و سەرەتایی دا بووە . داگیرکەران لە هەموو لایەکەوە چنگیان لە [ کوردستانی گەورە ] گیر کردووە . بەلام [ گیانی کوردایەتی ] لێرەو لە هەموو کوردستان دا ، پلی داوەو ، لەو پەڕی هێزو هەڕەتا بووە . شۆڕشێك لە [ کوردستانی تورکیا ] دا لە ئارادا بووە . شۆڕشێك لە [ کوردستانی ئێران ] دا تازە کوژێنرابووەوە . شۆڕشێکیش لە [ کوردستانی عیراق ] دا لە کەلێن دا بوو ، چاوەڕوانیی کاتی بڕیار دراوی خۆی ئەکرد کە لە شەشی مانگی مشتاخان [ ئەیلوول ] ی ئەو سالەدا دەست پێ بکات . بەلام لەلایەن [ شاکردانی خوێندنگاکان ] و [ ئافرەتانی کوردستان ] ەوە ئاگرەکەی خۆش ئەکرا . لەلایەن [ شێخ محمودی مەزن ] و [ نیشتمان

پەروەرانی کورد ] یشەوە پشتیوانی ئەکرا . جا نووسەر لەم سەردەمەدا بووە کە چۆتە [ گەشتی پێنجوێن ] . ئەرکێکی زۆری هاتۆتە بەرو ڕەنجێکی تەواوی داوە ، تا ئەم گەشتەی تەواو کردووە . لە ئەنجامدا ، بەجۆرێکی تێکڕایی وێنەیەکی پڕاوپڕی سوروشتە جوانەکەی پێنجوێن و، گوزەران و ژیانە سەختەکەی کوردەواری‌ی ئەوێ و شێوەی بیرو باوەڕو کیانی کوردایەتی‌ی ئەو ناوەی پیشان داوە . بێجگە لەوە کەلێك زانیاری‌ی تریشی لە بابەت کەسایەتی یە کوردەکان و ، شۆڕشەکانی کوردستان و باری ئابووری و خوێندەواری و نووسراوەکوردی یەکانەوە کۆکردۆتەوە .

هەڵبەت ژیان و گوزەران و پلەی پێشکەوتنی ئیمڕۆی پێنجوێن ، لەگەڵ هی ئەو سەردەمەدا ، جیاوازی‌ی زۆرە . جا بێجگەلە ڕۆشن کردنەوەی بیرت ، بەراوورد کردنێکی باری ئەوسای [ پێنجوێن ]و باری ئێستای [ پێنجوێن ] ، لە ڕووی زرنـگ کاری [ سیاست ]و کۆمەڵایەتی و خوێندەواری و ئابووری‌یەوە ، بە مەرجێ لە لایەن [ خۆت ] ە وە بێ ، چێشتـکەیەکی خۆش و کەڵـکێکی زۆرت پێ ئەبەخشێ . ئەمەیش ئامانجی ئەم نووسـراوەیە ، کە هیوادارم پێ‌ی بکەیت .

شاکر فتاح

[ خاوەنی پرۆژەی خوێندەواری کورد ]

[ سلێمانی ] : ١٥-١-١٩٧٣

# ڕێك کەوتن

٢٥ ـ ٧ ـ ١٩٣٠

دەمێك بوو ، بەئاواتی گەشتی پێنجوینەوە بووم . چونکە « پێنجوین » پارچەیەکە لە [ کوردستان ] ی خۆشەویست . نیشتمانمە وەکو سلێمانی . ئاووباو چاو ئەندازو باخو باخاتێکی هەیە ، لەهی هەرە شوێنە ناودارەکانی کوردستان ئەژمێررێ . چونکە کوردی تیایەو ، هەموویش بەزمانی [ کوردی ] قسە ئەکەن .

جا من چۆن نەدەچوومە [ پێنجوین ] کە ئەم هەموو شتانەی هەبێ و ، جێگایەکیش بێ ، شێری گەورە ، [ شێخ محمود ] ، دامەزرێنەری [ فەرمان ڕەوایی‌ی کوردستانی خواروو ] ی تێدابێ . وایش هەڵکەوتبێ کە هەموو فەرمان ڕەوا دوژمنەکان بەکورد ، بەپەرۆشەوە بن بۆی . . بەڵێ دەبوو بچوومایە [ پێنجوین ] . چونکە خوێندنگا داخرابوو . زۆرەی پشوو بوو . لەشیشم لاواز بوو بوو . دەبوو گیانم ببوژێنمەوەو ، لەشیشم بە تیین بکەمەوە ، تابتوانم لە پێناو پێش کەوتنی نیشتمانەکەما بەختیان بکەم . .

لەگەڵ هاوڕێو خزمێکما [ نوری ئەفەندي حاجی صالح آغا ] ، کەمەری ڕۆییشتنمان بەست . بە پیاوەتی‌ی ئەوەوە دوو ئەسپی کرێ گرتەمان دەست کەوت . ئەسپەکان هەرچەندە تروتفاقەکانیان نەختێ شڕوپڕ بوون ، بەڵام لە ڕەوتا خۆش ڕەو بوون .

دەستێ جلی کوردی ی جوانم هەبوو ، لەبەرم کرد . کاڵەیەکی نایابیشم لە هاوڕێیەکی خۆشەویستی کۆیی‌یەوە بە دیاری بۆ هاتبوو ،

لەپێم کرد . وێنەگر [ فۆتۆگراف ] ێکی باشیشم هەبوو هەندێ کەل‌و پەلم بۆ کڕی‌و هەڵم گرت . چەقۆیەکی هەورامی‌یشم هەبوو خستمە گیرفانمەوە . هەگبەکەیشم دابەست بەپاشکۆی ئەسپەکەمدا . لە پاش ئەمەی لە نان و چای خواردنی بەیانی بوومەوە ، هەردوو دەستی سەروەرانی‌خۆم ، باوکم‌و دایکمم‌ماچ کردو ، سواری بارگیرەکەم بووم‌و کەوتمە ڕێگا . هەربە غار ڕۆیشتم هەتا گەیشتمە بەرماڵی [ نوری ئەفەندی ] ی هاوڕێم .

[ نوری ئەفەندی ] یش لەخۆ کۆکردنەوەدا بوو . دەمێك بوو کاروانەکە بەجێ‌ی هێشتبووین . داممان لە ئاوزەنگی و غارمان کرد بە ڕێگای کۆیژەدا. ئەوەستاینەوە تاڵەوانیشمان تێپەڕ کرد . گەیشتینەچایخانەکەی شاخی [ کۆیژە ] . لەوێ دابەزیین . کە تەماشامان کرد کاروانێکی تریش لەوێ دابەزیبوو . ئەسپەکانمان بە کوێسوانەی چایخانەکەوە بەستەوە . هاتینە ناوەوە ، دانیشتین . بەڵام چیمان دی ؟... دیمان دووسێ کووپەی گەورە کە لەگڵی سوور دوروست کرابوون . دانرابوون لە ناوەڕاستی چایخانەکەدا . یەکێکیان هەر بۆ ئەوە دانرابوو ، کە لە تەنەکەی پاك‌و خاوێن‌دا ئاوی لەو کانی‌یە دوورەوە بۆ بهێنن کە کەوتووەتە دامێنی شاخەکەوە . لەو چایخانە چۆڵەوانی‌یەدا ، تەختی دانیشتنی‌وەها دانرابوو ، کە لەهەر چایخانە ناوونجی‌یەکانی سلێمانی کەمتر نەبوون . لە کاتێکا چایی هێنەرەکە ، چایی‌یەکەی بۆ دەخستینە سەر مێزێکی باڵا بەرز ، شنەی بای بەیان دەهات‌و گیانی دەکردینەوە بە بەردا . شاری « سلێمانی » یش وەکو تاقە سێوێك ، لە دوورەوە ،

دەر دەکەوت ، کە بە مێخەك نیگار ڕێز کرابێ . تارایەکی زێڕینی تیشکی ڕۆژیش تەوقە سەرو لق و پۆپی دارەکانی چیاکەو مێرگو مێرغوزارەکانی سەر شاخەکەی داپۆشیبوو . بەر چاییمان خواردو بە سەر شاخەکەدا بە ئەسپەکانمانەوە هەڵکەڕاین . لە پاشا کەوتینە خواریی‌و لێژاییی‌یەکەوە ، بە بارییکە ڕێیەکدا تێپەڕمان کرد . پاشان کەوتینە کوسپاییی‌یەکەوە ، بە ئاسانی پیادا ڕابوردیین . دیسانەوە هەڵکەڕاینەوە بەناو ئەو هەموو بەردەلانی‌یەدا ، کە ئیتر شاخەکە بە تەرحێکی وای لێ هات بە گران دەمان توانی بچین بەرێوە . لەسەر ئامۆژکاریی باوکم ، هەتا لەوسەر بەرەو خواریی‌یە بووینەوە سواری ئەسپ نەبووم . ئەسپەکەم بەدەسمەوە ڕائەکێشا .

منیش کیرفانم پڕ کردبوو لەنوقوڵو دەنکە کوولەکە . هەر بەڕێگاوە قسەمان دەکردو ، دەنك ، دەنك ، لەگەڵ هاوڕێ کەما لێمان دەخواردن. کەوتیینەوە دەشتایی . لە دوورەوە بێستانێکمان دی . بەغار چووینە ناوەوە کە پرسیارمان کرد هیچ شتێکی پێ نەگەیشتبوو . ئیتر بە شاخەکەدا هەڵکەڕاین ، تا چووینە سەر کانی یەك . ئاوەکەی گەلێ ساردبوو . خۆمانو ئەسپەکانمان تێروپڕ ئاومان خواردەوە. کەچی لەپێش ئەمەیشدا ، لە چایخانەکەی [ بناوییلە ] لامان دا بووو ، ئاویشمان نخواردبووەوە .

لەپاش ئەمەی چەند خوار و ژوورێکمان کرد هەستمان بە ماندوو بوونێکی تەواو کرد . هەر خوا خوای ئەوەمان بوو ، بگەینە جێیەكو لابدەین ، تا تێر ئاو بخۆینەوەو بحەسێینەوە . هەرئەوەندەمان

زانی لەسەر تەوقە سەری شاخێك چایخانەیەكمان بەدی كرد ، كەپیشتیینێو لامان دا . بەركولێكمان بۆ كرد . لەوێ كەلێك خەلكی سلێمانیی لێ بوو . هەمووموان دەناسیین . تەنانەت [ نوری ئەفەندی ] لادێیەكانیشی ئەناسی . چایی بۆ یەكێكیان كڕی . دەستیان كرد بە قسەكردنو ڕابواردن . كابرا دەستی كرد بە پیاهەڵدان [ مدح ] بە باپیری [ نوری ] دا ئیتر هیچ قسەی پێ نەما بیكات ، ئەمە نەبێ ، كە هەموو مـانی پێ هێنایە پێكەنین . گوتی :« بەخوا باپیری خوالێ خۆش بووی نێركەلەكێشێكی باش‌بوو !.. » ڕۆیشتیین ئەوەندەمان پێ نەچوو كەوتیینە سـەر تەوقە سـەری شاخێك كە پانو فراوان بوو . ئۆتۆمۆبیل بە ئاسانی پیا دەڕۆیشـت . [ نوری ئەفەندی ] پەنجەی درێژ كرد . لە دامێنی شاخەكە ، لە ناو دۆلو چالاییەكی قوول‌دا دێیەكی جوانكیلانەی پیشان دام . هەرچوارلای بەباخو ڕەزو داری چنارو شـۆڕەبی تەنرابوو . گوتی ئەمە دێی [ نۆدێ ] یە . دێی [ شێخ مارف ] ە باوكی [ كاك ئەحمەدی شێخ ] ی ناودار ، كە بە ڕەنج دانی لە پێناو چاكەی [ كوردەواری ]دا بەناوبانگە . كەلێ باسی ئەوێی بۆ كێڕامەوە . لە پاشا بایەكی فێنك بەسەرماندا كشەی كرد . منیش دەستم كرد بەگۆرانی گوتن . دلی هاوڕێكەمم بەوە خوش‌كرد . ئێمە لە كاروانەكە كەلێك پێش كەوتبووین . تینوێتی‌یـش زۆری لێ سەندبووین . جلەوی ئەسپەكانمان كێشایەوەو جگەرە كێشێك وەستاین، هەتا ئەوانیش هاتن . ئاومان لێ سەندن . خواردمانەوە . ئنجا هەر چوارمان بەناو ئەو دۆلو شاخە بەردەلانی‌یەدا بە گۆرانی ووتنو قسە

/

کردنو تریّو ترۆزی خواردن کاتمان ڕابووراند . دیّی [ چنکیان ] یشمان لەوبەری شـــاخەکەوە ، لەدوورەوە بەدی کرد . ئیتر هەر ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە سەر چەمو ئاوێکی گەورە . بایەکی گەرمی ناخۆش بەســـەرماندا تێپەری . چەند ماڵو کۆچێکمان لەژێر دارە بەڕووەکاندا چاو پێ کەوت . لای ئەوان لاماندا . هەتا بەری بەیان ماینەوە . کەیەك سەر ڕوومان کردە [ پێنجوێن ] .

## ( چەمی ووێباوا )

گەیشتینە ناو چەمەکە . لەپڕ کابرایەکی لادێییمان پێ گەیشت . ڕێ بەستی چەمەکەی کردبوو . خەریکی ماســـی گرتن بوو . سەبەتەیەك و ساچێکی بە دەستەوە بوو . کە ئێمەی دی هەردووکیانی فڕێ داو هەرای کردە ناو ئاوەکەوە ، دەستم ماچ بکات . وای دەزانی من [ شێخ لطیفی کوڕی شێخ محمود ] م . بەلام ، من بەکاڵ بەوە پێم گوت : « شێخ لطیف نیم . بەڵام خزمی شێخ محمودم » . هەتا هاتە نزیکی ئەسپەکەمەوە وورتەم نەکرد . بەڵام خۆم بۆ نەگیرا ، ئەو بەندەگی و ڕەنجبەرێتییەی لێ پەســـەند بکەم ، لە پڕ دەرم بڕی ، گوتم : « شێخ نیم مامەگیان » . ئیتر ئەویش بە پێکەنینێکەوە گەڕایەوە ..

چووین لە بن دارەکەدا ، ئەسپەکانمان بەستەوە . چاییمان سازکرد . هەندی ئاوی ساردمان نۆشی . دەستمان کرد بە خۆرشتی خۆش خواردن .. ڕاکشاین ، بنووین . هێشتا تەواو چاومان گەرم نەکردبوو ، لە دەنگە دەنگی کاروانەکان و زرنگە زرنگی زەنگۆڵەی

ئێسترو بارگیرەکان خەبەرمان بووەوە . کە تەماشامان کرد ، ئەوا کۆمەڵێکی گەورەی کاروانەوانەکان و خەڵکی سلێمانی چایی یان لێ دەم کردووەو ، بە ئارەزوویەکی تەولوەوە نانی پێوە دەخۆن ، بەدەم ئەوەیشەوە قسە ئەکەن .

من وام ئەهاتە پێش چاو ، کە لە سایەی ئەم کاروانانەوە کەلێ بە کەیف و خۆشییەوە ڕادەبوێرین . چونکە لەژمارە نەدەهاتن . کەچی ماندوێتیی ڕێگا بە تەرحێکی لێ کردبوون ئێمەیشیان بڕست بڕاوکرد ، نەمان دەزانی چۆن ڕابوێرین .. کات بووە ساتی نۆهەم(۱) . من و نوریی هاوڕێم ، بەرگی مەلەکردنمان پۆشی و لە ناو هالاوی گەرما ، تێرو پڕ لە ناو ئەو چەمە خۆشەدا مەلەمان کرد . ئنجا خۆمان پۆشتە کردەوەو ڕوو بە ڕووی کانی و مەرەزەیەکی دوور ڕۆیشتین . بەناو دەشتێکی فراوان دا ڕێگامان بڕی . کەییشتینە بەرمەرەزەیەك ، کە لە کاتی گەشیدا بوو . تیشکی ڕۆژ دوو هێندەی جوان کردبوو . لەو بەری ڕێگاکەیشەوە زەوییەکی پان و درێژ بە تووتن چێنرابوو . ڕەنگە ئەتلە سییەکەی لەبەر تیشکی ڕۆژ دەبریسکایەوە . هەر وەکو دەسکە گوڵێ کە بە گەڵای ترنجۆك پێچرابێ ، کۆمەڵێ کیژو ئافرەتی جلك ئاڵ ، لەگەل مێردو باوکیاندا خەریکی بژار بوون ، ناو دووکانە تووتنەکانیان ڕازاندبووەوە . بەڵێ وابوو : ژن و پیاو ، بە یەکەوە تێ دەکۆشان ، ماڵەکەیان ئاوا بکەنەوە ، منداڵەکانیان ، واتا کوڕو کچەکانیان بحەسێننەوە .

---

(۱) لێرەدا مەبەس کاتی کوردییە ، نەك فەرەنگی .

ئای ئەوە چ تەماشاگاهێکی جوان بوو !؟. بەڵام چیمان بکردایە ؟ تینوێتی زمانی شکاندبووین . بە ناچاری لەگەڵ هاوڕێ کەمدا ڕوومان کردە شاخەکە ، کە لادێ یی یەکان ناردیانین بۆ کن کانی یەکی سازگار . لێمان دا ڕۆیشتین گەیشتینە کن کابرایەکی تووتنەوان . پرسیارمان لێ کرد . ووتی : لێرە نیە ، لەو لاوەیە . ئێمەیش هەر ڕۆیشتین ، هەتا گەیشتینە ناو دۆڵێکی تەسك لە ناو دوو شاخدا . بە ڕێگایەکی باریکەلەی سەختەلانی و ، سەر بەرەو ژوورەو سەر بەرەو خوارەدا ، چەند سەد هەنگاوێکمان بەو قەد پاڵەدا بڕی . وامان لێ هات پرستمان بڕا هیوامان نەما . ئەوەندەی نەمابوو زمانمان بشکێ ، لە پڕ جۆگەلەیەکی تەسکەلانەمان هاتە پێش چاو . وەك درزێك وابوو ، بە ڕووی شاخەکەوە . کە سەرنجمان دا ئەو کانی یە بوو کە سێ چارەکە سات بوو ، دوو بە دوو بۆی دەڕۆیشتین . چیمان دی؟!کانی یەکمان دی ، ئەوەندە سارد ، ئەوەندە سازگار ، هەمووئێش وئازارێك ، هەموو ناخۆشی یەکی رابووا ردنی سەرچەموماندوێتی ی ڕێگاکەی لەبیر بردینەوە.

هەرچەندە کانی یەکە یەجگار تەسك و سەربەرەوخوار و لێژ بوو ، هەرچەندە ئەوەندە جێی دانیشتنمان نەبوو ، کە بە ئاسانی تیا ، دابنیشین ، بەڵام ئەو چیمەن و نزارە ، ئەو سێبەری لالە زارە ، ئەو شنەی شەماڵە ، ئاوە ساردەکەیشی کە بەلاوە بوو ، وای لێ کردبووین ، دەستمان بە ئەژنۆدا ئەدا ، هەناسەمان هەڵدەکێشا ، کە لە بەیانی یەوە لە وێدا نەبووین ، تا زۆرتر شادمان بیین .. هەندێ ئاومان خواردەوە ، بەڵام لە ئەندازەی خۆمان زۆرتر بوو .. پشوویەکی شادمانی مان دا .

هەرچی وورده شیرینی‌یەکمان پێ‌هەبوو ، بە کەیفەوە دامان کرماند. ئەمەندەمان پێ‌خۆش بوو ، بە خۆمان نەزانی ، کاتێکمان زانی ئێواره داهات !.. ڕۆژ کەوتە کێوان ، لە کەلەوە نزا خوازی‌ی لێ‌کردین . وە نەبوو بی‌تاریکی بکەیشتینایەوە هەوار . بەڵام ڕۆژی ڕووخۆش نەیهێشت بکەوینە بێ ڕۆژی‌یەوە ، خۆی لەپشت کێوانەوە ، چرایەکی سووری بۆ هەڵ کردین . تیشکی دەهاویشت . پەڵە هەورەکانی بەڕەنگاو ڕەنـگ ، زەردوسووروزێڕین کردبوو ، لەلایەکەوە بەڕیزهەموو تەرحە کیاندار و دڕندەیەکی لێ‌دروست کردبوو ، لە لایەکی تریشەوە دەتکوت بەهارەو شایی‌یە ، بە کەردنی یاقییقبین و سەروپۆتەڵاکی زێڕینەوە ، کییژە کوردنو ڕەش بەڵەك و هەڵپەڕکێ دەکەن ، لە خۆشی‌ی هاتنی جەژنی نەورۆزی پیرۆز .

گەیشتینەوە هەوار . لە ناو ئەو هەموو چیمەن و لالەزارەدا ، لە ناو ئەو بای شـەماڵەدا ، ئاوێکمان هاتە بەر . چەمەکەبوو ، کە بە ناو دەربەندەکەی [ وولیاوا ] دا دەهاتە دەرەوە ، بەسـەر ئەو بەردانەدا تافە تافی ئەکرد ، بە ناو ئەو دارانەدا هاژە هاژی ئەکرد . ئەویش وەك ئاوینە ، وێنەی ئەو پەڵە هەورە ڕەنگارانەو ئەو ئاسمانە گەورەیەی ، بە ڕەنگە شینەکەیەوە ، هەروەها وێنەی ئەو کەلاّونەودارو درەختانەی ئەنواند . دەتکوت ئاوێنەیەو وێنەی ئەو چاو ئەندازانەمان بۆ ئەنوێنێ ، کە تۆزێ لەوە پێش پێ‌ی شادو دلکوشاد بوو بووین .

پەڕیینەوە . هێشتا نەگەیشتبووینە سەر هەوارەکە ، کابرایەك هات ، سێ ماسی‌ی بۆ هێنابووین . لێمان وەرگرت . بە دڵێکی خۆشـەوە

بڕژاندمان . ئۆخەی! چەندە بەچێژبوو ! هەرگیز ئەوخۆشی‌یەم لەبیر ناچێتەوە . کە نانمان خوارد . بێجگە لە ماسی‌یەکان شفتەیشمان پێبوو . چاییشمان لێنابوو . بێتۆ ناخۆش ، خۆشی‌یەکی زۆرمان لێچێشتن . ئێستەیش چێشکەیان لەژێر دانماندایە!.. کە نان خورا ، بێ دەنگی هەمو لایەکی داگیر کرد . چونکە ماندوو بوون و ئەیان ویست بەیانی ، لە خەو زوو هەڵسن ، زۆری پێ‌نەچوو خەویان لێکەوت . کەس ئەو بێدەنگی‌یەی تێك نەئەدا منو [ نوری ئەفەندی ] و کاروانەوانەکەمان نەبێ . لەپڕ ووتم : « ئۆخەی ! ئێستا من خۆم لە خۆشی‌یەکی بێ‌ئەندازەدا ئەبینم . کاشکی‌هەر وام ڕابواردایە . بەڵام خۆزگە ، لە سەری ئەوکەلەوە ـ دەستم بۆیان درێژکرد ، کەلی ڕۆژئاوای ( ولیاوا ) م پیشان دان ـ ئەلەکتریکێك دەبوو ، ئەوەندەی تر ئێرەی نەشئە پەخشان بکردایە !.. ئاخ ، ئێرە ، چ جێگەیەکی خۆش دەبوو ئەو حەلە..!؟ » . کاروانەوانەکەمان پێ‌کەنی . [ نوری ئەفەندی ] یش بە تەوسێکەوە گوتی : « بۆچی . دەشێ . ڕاست دەکەی بەخوا زۆرجوان دەبوو !. » .. بەڵام ئەو ئەم قسەیەی هێشتا تەواو نەکردبوو ، هەر ڕووم لە کەلەکە بوو ، بەقاییم دەستم کێشا بەسەر شانی [نوری] دا و ڕوویشم وەرگێڕا بۆسەر شاخەکە !.. بەڵێ ڕاستە ، ئەم ئەو ئەلەکتریکەی من دەمویست بیییینێ ، ئەی دی ... بەڵام ئەلەکتریکێکی وای دی کە بێ‌کۆڵەکە وەستابوو . بەبێ تەل و دەرمان ئەچریسکایەوە . بێ‌تەقەوچرکە ، دەجریوایەوە . ئەویش شتێك بوو خوا نەبێ کەس نەیناردبوو . یەزدانیش نەبێ لە دەستی کەس نەدەهات بینێرێ . ئەویش ئەستێرە کەشەیەك بوو ،

هەر وەك خوای گەورە بۆ دەرخستنی ڕاستیی قسەکەی من ، یاخود بۆ هێنانە دیی ئاواتەکەی من ناردبێتی وابوو .
ئەستێرەکە لەو دیو شاخەکەوە بە نازو جیازێکەوە هەڵ هات . بەرە بەرە سەرکەوت ، تا هاتە ئەو شوێنەی، کە بەئارەزووی دڵی من هەزار ئەوەندە زۆرتر چاو ئەندازەکەی ڕەنگیین کرد !..
شەوی پێشوو کەم نووستبووین . لەبەر ئەوە پێخەفمان لێ ڕاکێشاو خۆمان بێ دەنگ کرد ، نوستیین ، تا ساتی هەشت و نیوی شەو .

## ( بۆ پێنجوین )

١٩٣٠_٧_٢٦

هەرچەندە ئەو شەوە هەموو لایەکمان ، بە ئاخوڕی بارگیر چوار لامان گیرابوو ، نە سەرین هەبوو ، نە دۆشەك لە سەری بنووین . تەنیا لەسەر مەوجێك و ، بە مەوجێك ، بە جلە کانمانەوە نوستیین . بەڵام لەبەر ماندوێتیی ڕێگا و خۆش کردنی بایەکە خەوێکی خۆش و ئاسانمان لێ کەوت . بەخۆمان نەزانی ، تابەیانی بەزۆر خەبەریان کردیینەوە . .
کە هەستاین ، ئەسپەکان ئامادەکرابوون .. باریش ڕێك خرابوو.. هێشتا تاریك و ڕوون بوو ، دەستمان کرد بە ڕۆیین . بەسەر شاخەکەدا سەرکەوتیین . کەوتیینە ناو بەردەلانی یەکەوە . لە بەر تاریکییش ، کەلێك جار ئەسپەکانمان هەڵ ئەنکووتن . نزیکی سات و نیوێك بەو تەرحە ڕۆیشتیین هەتا دەمەو هەتاوکەوتن کەوتیینە ناو دەشتایی یەکەوە کە کانی یەکی ساردی لە ناوەڕاستابوو .

چەند بەردە نوێژێك بە لایا چەسپ کرابوو ، بۆ نوێژ کردن . بەهەر چوارلای کانییەکەیشدا بێستانی کاڵەك و ترۆزی بەرهەم هێنرابوو . لەدوور کانییەکەیشەوە ، چایخانەیەکی بچووك هەبوو. بەسەر چەمێکی قووڵدا ئەیڕوانی کە ئاوێکی جوانی بە ناودا دەڕۆیشت . لەوبەریشەوە، لە دوور لە سەربانێك دێیەکی بچووك هەبوو . [ زەلان ] یان پێ ئەکوت . ئەمە ئەو [ زەڵان ] ە بوو ، کە بە ئاروو [ خەیبار ] بە ناوبانگە . لە وێ لامان دا . دەستمان کرد بە دەم و چاوشتن . ئنجا دەستمان کرد بە چایی خواردنەوە . بەڵام ئەمەندە زۆربووین ، چاییمان بە ئاسانی بەرنەئەکەوت . ناچار خۆرشتەکەمان بە کاڵەك و ترۆزی یەوە خوارد !.. کاتێ ئێمە لەوە دابووین ، جار بە جارێ ئاوورم ئەدایەوە . چاووم بە چاو ئەندازی شاخەکە ئەکەوت ، کە تەوقە سەرەکەی زێر بەندی تیشکی ڕۆژ بوو بوو . تیشکەکەی لەناو ئاوەکەی ئەدا . شنەشنی دارو درەختەکەی لە ناو دا دیاربوو . کزەبایەکی خۆشیش وەك سۆزیی بەهاران ، جار بە جارێك ئەهات بەسەرما ، کەیفی پێ ئەسەندم ، نەشەی پێ پەیدا ئەکردم ..

لێماندا ڕۆییشتین ، ڕێکامان کەوتە خۆشانی . بەم لاو بەولاماندا وەکو شەقامەکانی شارە پێشکەوتووەکان ، دارودرەخت ڕووابوو ، هەتاو بە ئاستەم لێی ئەداین . هیچ ئازارێکمان لەم ڕێکایە نەچێشت هەتا گەییشتینە ناو چڕە دارستانێکەوە ، کە ئەو دەمە هەشت سات بوو بە ڕێکاوە بووین . سەرەوەی سەرگردەکە بوو ، کە ئێمەی پیا دەڕۆییشتین . خوارەوەیشی پڕبوو لە هەزاران جۆر داری زلە ،

زله ، تووترك ، داری بەردار ، کە جێگای دڕندەی کێوان بوو ، وەك وورچ و پلنگ . ئەوە شاخی [ تاری یەر ] بوو ، کە بەسەختی و بلندی بە ناوبانگە .. بەسەر بەرەو ژوورەیەکی یەجگار ناخۆش و پێچ پێچۆکەدا سەرکەوتین ، تا وامان لێ هات لە تەوقە سەری شاخەکەدا یەکمان کەوت . ئنجا بەزەییمان بە بارگیرەکانماندا هاتەوە . تۆزێ دابەزیین ، لە ژێر داری دار بەڕوودا پشوویەکمان دا . ئیتر بایەکی شەماڵی فێنکمان هەناسە دا . هەر ئەوەندەمان زانی کورە کاروانەوانێکی پێنجوێینی پەیدابوو . چەمچە [شقارتە] یەکی لێ سەندیین و بە ڕاکردنێکەوە ، بە پێ ، بەوشاخە سەر بەرەو لێژەدا داکەڕایە خوارەوە ، هەر بۆ ئەمەی چایەك بۆ ئێمە ساز بکات . ئێمەیش لە دوایەوە ڕۆییشتیین . وامان دەزانی لە دامێنی شاخەکەوە کانی هەیە . کەچی هەردەڕۆییشتیین و نەی دەگەییشتینێ ، هەتا هێزمان لێ بڕا . لە ئەسپەکان دابەزیین بەپێ ڕۆیشتیین . ئنجا بە پێیش ماندوو بووین . دوو بارە سوار بووینەوە . کەوتیینە ناو دەشتێکی گەرمەوە خەرمانێکی لێ بوو . دوو پیاو و ژنێك و کچێکی یەجگار جوان خەلەیەیان کۆدە کردەوە . بە دەستی کچەکە دۆیەکی خۆشمان بۆ هات و خواردمانەوە . سێ چارەکە ساتێکی تریشمان بەسواری ڕابوارد . ئنجا گەییشتیینە کانی‌ی [ أمین بەگ ] ، کە لە کانی یە هەرە سارد و سازکارەکانی پێنجوێین دەژمێررێ . لە وێ دابەزیین . پشوویەکمان دا. خۆرشتمان خوارد . چایی‌ی کورەکەمان نۆش کرد ، ئنجا بەناودەشتی کاکی بە کاکی‌ی [ قـزلجە ] دا ڕێ مان بڕی . لە پاش ساتێك و

چارەکێك کەپیشتیینە [ پێنجوێن ] لەجێی سەربازەکان تێپەڕمان کرد . چووینە ماڵێکەوە کە بەرامبەر شاخەکە بوو . جێیەکی فێنك و خۆش و پڕ سەربەستی بوو .

## پێنجوێن

۲٦-۷-۱۹۳۰

دێیەك بوو ، بەڵکو شارێك ، جوانکیلانە بوو . لە هەر چوار لاوە بە باخ و باخچەی ڕەنگیین تەنرابوو . جێیەك بووجگە لەجوانی ، جگە لە ئاوو با خۆشی ، جگە لە ڕازێنراوەیی بە چـاو ئەندازی جوان ، بە گەورەیی شوێنی لە بەرچاو فەرمان ڕەوایی دا ، بەشوێن سەختی بەوسێ شاخەوە کە دەورەیان دابوو : [ کێوی ئەحمەد هاجەر ، کێوی بەرکێو ، کردی بلکیان ] ، وەك کلیلێك وابوو کە کلۆمی ( ئیران ) ی پێ بکرێتەوە . بێجگە لەوە ئەگەر [ پێنجوێن ] قاییم نەبوایە ، چۆن [ شێخ محمودی گەورە ] ، ئەو دەوروپشتەی ئەوی ئەکردە نیشتەجێی خۆی ؟!.

[ پێنجوێن ] پڕبوو ، لە کانیی گەورە گەورەی ئاو سارد ، بەڵام کاشکی ئاوەکەیان قورس نەبوایە . تەنانەت ، کانییەکی تیا بوو ، لەبەر قورسیی ئاوەکەی ، بە ئاوەکەیان ئەگوت : [ ئاوئاسن ] . بەڵام کانیی [ ئاوی حەیات ] لە هەموویان ساردترو شیرینتر بوو . لەم بەری دێیەکەوە کە گەڕەکی [ بەرکێوان ] یان پێدەگوت : کانی کەم هەبوو لە بەر ئەوە بەسەر شیوەکەدا جۆگەلەی داریان ڕایەڵ کردبرو ، ئاویان پیا هێنابوە ئەم بەر. ئەوشاخەی کە یەجکار

ناوی هەبوو ، [ ئەحمەد هاجەر ] بوو ، کە کەوتبوە ڕۆژ هەڵاتی [ پێنجوێن ] ەوە ، تەنانەت لە چەمێکی دوورەوە ، لەبەر چاندن ، بەم گردە بەرزەی شاخی [ ئەحمەد هاجەر ] ە دا ، ناویان ڕاپێچ کردبوو ، جا هەر ئەو ناوە زۆرە بوو کە [ تافاو ] یکی گەورەی لە ناوەڕاستی شاخەکەدا دوروست کردبوو ، کە بە هۆی ئەوەوە تەماشاکاهی شاخەکە جوانتری لێهاتبوو . هەروەها هەر ئەو ئاوەیش بوو ، کە دەهاتە بەری [ بەرکێوان ] بۆ شینایی و بۆ با خەبەردارەکان ، کە هەموو تەرحە درەختێك و سەوزاییەکی لێکرابوو . لە دەستە ڕاستی [ پێنجوێن ] یشەوە چەندگردێك هەبوون ، سەروخواریان باخ و باخچە بوو . بەئاوی سازکاریکانی‌یەکان ئاو ئەدران . پڕبوون لە میوەو سەوزەوات ، وەك : هەڵووژە ، سێو ، هەرمێ ، ترێ ، قۆخ ، قەیسی،شاتوو، توو، ئاروو، ترۆزی ، شووتی و کاڵەك . پێنجوێن دووباخی زۆر گەورەی تیابوو : یەکێکیان [ چوار باخ ] ، ئەوی تریشیان ( بلکیان ) یان پێ ئەگوت . ئاوی [ بلکیان ] یش ئەمەندە ساردبوو پیاو نەی ئەتوانی دەستی زۆر تیا ڕابگرێ . لە دوای ئەمانەیشەوە شاخێکی بلند هەبوو . شاخی [ کانی شەوقەت ] یان پێ‌دەگوت . ئیتر ئەگەر تەماشای [ پێنجوێن ] بکرایە ، هیچ دەستە ڕاست و دەستە چەپی ماڵێکی نەئەبینرا کە بێ باخ و باخچە بووایە .

ئەگەر یەکێ لە دوورەوە بهاتایە [ پێنجوێن ] ، کوتو پڕ پێی دەگوت : کوندە . بەڵام کە ئەچوەناوەوەو ڕێك‌و پێکی‌ی ماڵەکانی‌و ، زۆری‌ی دانیشتووەکانی و ، بازاڕو دووکانەکانی و ، سەرشۆرك و

مزگەوتەکانی‌و ، شێوەی ئاش‌و ئاودانی زەوی‌یەکانیانی ئەکەوتە بەرچاو، بە شارێکی زۆر ڕێك و پێکی دائەنا .

نزیکی پەنجا دووکان ، کە هەموویان لەهاوییندا وەك ساباتوان ، چوار چایخانە ، قەیسەری‌یەك ، سەرشۆرکێك کە ئێستە ڕووخاوە ، چوار مزگەوتی گەورە کە لە هینەکانی سلێمانی کەمتر نەبوون ، دووسەدو پەنجا خانووی دوو نهۆمی‌ی تیابوو . جا بەپێ‌ی ئەمانە ، وا دیاربوو ، کە [ پێنجوێن ] حەلی خۆی لە ئێستا زۆرتر خەلکی تیا بووە . چونکە وەك دانیشتووانی [ پێنجوێن ] خۆیان ئەیانگێڕایەوە ، ڕووسەکان لە شەڕی گەورەی جیهانی‌ی یەکەمدا ویرانیان کردبوو . ئێستا ژمارەی دانیشتووانی ( ۱۲۰۰ ) کەس کەمتر نیە . هەموویان خاوەنی باخ و باخچە ، یاخود کاروانن . یان بە بازرگانی‌یەوە لەگەل ئێراندا خەریکن . مانگاکانی [ پێنجوێن ] ڕەنگێکی زۆر سەیریان هەبوو . ناوەڕاستی پشتیان سپی ، یاخود پەلەی سپی‌ی تیابوو . لە ناوچەوانیشیاندا سێ سووچێکی سپی‌ی جوان هەبوو . هەر ئەتکوت ئەو مانگایانەن کە [ مصری ] یەکانی کۆن ئەیانپەرستن .

هەروەها مەڕومالاتێکی بێ‌شوماریان هەبوو . هەموو قەلەوبوون . گۆشتی سلێمانی ، بەشی زۆری لە پێنجوێنەوە دێ . چونکە پێنجوێن لە کوێستانەکان ئەژمێررێ .

[ حامد بەگی مجید بەگی جاف ] کە قائمقام بوو و لە هەلەبجە دائەنیشت ، خەریك بوو خانوو لە پێنجوێن‌دا دوروست بکات . لەگەل

[ احمد بەگی عثمان پاشای جاف ] ی خزمیشیا خەریك بوون ، هەموو بازاڕی پێنجوێن ، کە لە سالی هوروژمی ڕووسەکانەوە ڕووخێنرابوو ، لەگەل قەیسەرییەك و سەرشۆرکێکدا دوروست بکەنەوە .

[ پێنجوێن ] جێیەکی زۆر گەورەیە . دەشێ ڕێك بخرێ . خوێندنگای بۆ بکرێتەوە . ئەوا ئەمسال خەریکن بۆی بکەنەوە . ئێستاکە مەلایەك حوجرەی کردۆتەوە . [٢٢] شاگردی هەیە . وانا [ درس ] یان پێ ئەلێ . بەلام لەسەر شێوەی تازە نیە . لە شوێنێکی تردا لێی ئەدوێم .

[ پێنجوێن ] بە چاو ئەندازی جوان ، کەم شوێن ئەیگاتێ . بە شێوەیەکی تێکڕایی ئاوو بایەکی باشیشی هەیە . پاشە ڕۆژ ، دەبێ بە هاوینگاه . چونکە ئەمیش ( لوبنان ) ێکە بۆ خۆی و لەویش کەمتر نیە . ئێستە بنکەی لادێ [ ناحیە ] یە . سەرایەکی باشی تیا دوروست کراوە . بە ( ١٥٠ر٠٠٠ ) ڕوپیە تەواو بووە . لەسەر کردە کانیشی دوو بنکەی بالباز دامەزرێنراوە .

× ×

جێگایەکی خۆشمان دەست کەوت . هەر ئەوەندەمان زانی [ محمد علی ئەفەندی ]ی برای هاوڕێ کەم ، هات ، کەلێ قسەی خۆشمان کرد . نانمان خوارد ، کەچی لە کانیی [امین بەگ ]یش کەلێکمان خواردبوو . لە پاشا [ میرزا مارف ] ، ژیرە پیاوی بە ناو بانگیش هاتە لامان . لە دواییدا ئەوان ڕۆیشتن . ئێمەیش تۆزێ نوستیین . چاوێکمان گەرم کردو لە خەو هەلساین . چووینە مزگەوتێ کە لەلای

ماڵەکانەوە بوو . ڕێك و پێك و پاك و خاوێـنمان هاتە پێش چاو . ئنجا ڕاستەوخۆ چووینە لای [ نوری ئەفەندی عزیز ] ، کە ئەودەمە بەڕێندەرێك بوو لەوێ . لە دانیشتووانی سلیمانی بوو . گەلێ نازی کرتیـین . هەموو ناوبازاڕی گێڕاین . دێیەکەیشی تەواو پیشان داین . بردیینیە ناو باخێکەوە . لە وێ هەندێ هەڵووژەو ئاروو و ترۆزیو شووتی‌یان بۆ هێناین ، خواردمان . گەڕاینەوە . لە پاش نان‌خواردنی ئێوارێ چووینە چای‌خانەکانی پێنجوێن . یەجکار جوانم هاتنە پێش چاو . بە لۆکس و تەخت و ئاوازە [ گرامە فـۆن ] ڕازێنرابوونەوە . هەموو چایچی‌یەکان خەڵکی سولەیمانی بوون . هەموویانم ناسی‌یەوە . پاشان بە سایەی [ نوری ئەفەندی ] یەوە چووینە ناو [ تەل خانە ] کەی پێنجوێنەوە . لە وێ گوێمان لە ڕادیۆ گرت . هەرچەندە ، هێشتا زوو بوو ، بەڵام سازو ئاوازی ڕووسیاو ئێرانو هی هەڵپەرکێی لەندەنمان بە پیانۆوە گوێ لێبوو . حەزمان لە سـازو ئاوازی تورك ئەکرد . کەچی گوێمان کەوتە بەر ووتار ( خطبە ) ێك لە بابەت بڕانەوەی شۆڕشی کوردەوە ، کە ئەو دەمە کوردەکانی تورکیا بۆ ئازادی‌ی کوردستان هەوڵیان ئەدا . ئیکە ئەوەندەی پێ‌نەچوو هاتیینەوە ماڵەوە . نوستنێکی بێ‌ئەندێشە نوستیین .

## پێنجوین
## ١٩٣٠—٧—٢٧

ئەو ئێوارەیەی پێشوو بازارەکەمان باش نەدی . چونکە هەموو دووکانەکان داخرابوون . بەڵا کە بەیانی بە ناویانا گەڕاین ، لەهەموو

ئەرحە کارکەرێکمان هاتە پێش چاو : ئاسنگەر ، چەقۆدوروست کەر ، نالبەند ، مسگەر ، مەڕ سەربڕ ، کەبابچی ، سەوزە فرۆش ، چایچی ، سەرتاش ، ووردەوالآ فرۆش ، جگەرە فرۆش ، هەر جۆرە دووکانێك کە لە شاردا هەبووبێ ، دیمان . ئنجا چووینە ناوسەراکەوە . تێی وورد بووینەوە . سەرایەکی زۆر ڕێك و پێك بوو . لەسەر شێوەیەکی تازە دوروستکرابوو . چیمەنتۆو ئەرحە خشتێکی سووری تیا بەکار هێنرابوو ، کە لە گڵی پێنجوێن و لە کوورە خانەی پێنجوێنا دوروست کرابوو ، خشتەکان کۆشکەکەیان یەجگار ڕازاندبوەوە . سەراکە ، دوو حەوشەی هەبوو . بەهەر چوار لای دا هەیوانی هەبوو. ژوورەکانی لە چەشنی هی قەڵآ دوروست کرابوون . پەنجەرەکانیان زۆر بەبەرزییەوە بوون . خانوویەکی پچووکیشی تیابوو . بۆ کارگێڕی لادێی پێنجوێن دوروست کرابوو . لەسەر شێوەی ڕۆژئاوایی بوو ، هەموو فەرمان بەر [ موظف ] ە کان لەم سەرایەدا دائەنیشن ، بە بالباز [ پۆلیس ] ە کانیشەوە . سەرێکمان لەکارگێڕی لادێ یەکە ، [ رشید ئەفەندی غفور ] دا . گەلێ میوان نەوازیی کردیین ، ئەم پیاوە هەرچەندە بۆرە خزمێکم بوو ، بەڵآم ئەمە یەکەم جار بوو گفتگۆی لەگەڵدا بکەم . بەڕاستی کاروباری لادێیەکەی بەپەنجە هەڵ دەسووڕاند . بە کاربوو . بە جەرگ بوو . دل تەڕیش بوو . لە قسەکردن و ڕازاندنەوەیا دەستێکی درێژی هەبوو . دەمی لەهۆنراوە گوتنیشەوە ئەدا . بەڵآم تیا قاڵ نەبوو بوو . کەچی هەندێك لە فەرمانبەرەکانی ژێر دەستی بە خراب لێی ئەدوان . لە وێ هاتیینە

دەرێ ، چووینە لای [ میرزا مارف ] ، کە لە وێ بنووس [کاتب]ی لادێ یەکە بوو . کورد پەروەرێکی ڕاستەقینەم هاتە پێش چاو . کاتی خۆی شاگردێکی ئایینی بووە. بەڵام بەپیاوانی ئایین و ئایین کەم باوەڕ بووە . بۆ ئەمەی خۆی ئازاد بکات لە مزگەوت ، خۆی دەرباز کردووە بۆ ناو ژیانی فەرمانبەرایەتی یەوە . لە تورکیاو عیراقو سوریەو کوردستاندا کاری کردووە . ئەم پیاوە ، وەك بۆیان گێڕامەوە ، لەو دەمەدا کە ئینگلیزو کورد نارێك بوون ، لەلایەن [ ئەدمۆنس ] ەوە کە ئەوسا کە ڕاوێژکاری کاربەدەستی ی ناوخۆی عیراق ، واتا [مستشاری وزارتی داخلیە ] بوو - لێی داوا کرا کە ببێ بە نووسیاری و هەرچی کەینەوبەینەیەکی [ شێخ محمودی گەورە ] هەیە ، پەیتا ، پەیتا بیبنێرێ بۆ ئینگلیزەکان . ئەمیش ، چونکە ناپاکیی پێ جوان نەبوە بیبکات لە گەڵ گەلی خۆی دا ، خواستەکەی [ ئەدمۆنس ] ی پەسەند نەکردووەو بە هەموو هێزێکەوە بەرپەچی داوەتەوە . لە سەر ئەوە [ ئەدمۆنس ] بەڵێنی لێسەندەوە کە هەتا زیندووە لە سەردەمی ئینگلیزدا کاری فەرمانــ ڕەوایی داوا نەکات و وەریشی نەگرێ !.. بەڵام لە پاش چەند ساڵێك چاویان لێ پۆشییەو کردوویانەتەوە بە فەرمانبەر .

[ میرزا مارف ] ، وە نەبێ ، بێ ئایینێکی هەرزە کارانە بووبێ . ئەو تەنیا ئەوەی بەرپەچ ئەدایەوە ، کە بە مێشکیا نەئەچوو . بەڵام ڕاستت ئەوێ مەی خۆر بوو . لە شێوەیەکی ڕێك و پێكدا مەیی ئەخواردەوە . زۆر سەربەستم ئەهاتە پێش چاو . هەرگیز لە قسەی

ڕاستیش لای نەئەدا . زیانیشی پێبگەیشتایە ، قسەی ڕاستی خۆی هەر ئەکرد . تەنانەت لە کاروباری ئایینی‌یشدا ، لەناو ئەم کەلە ئایین گیرەدا لە قسەی سەربەستانەی خۆی نەئەکەوت .

لە ناو ڕۆژنامە کوردی‌یەکاندا قسەی جوانی بڵاو ئەکردەوە . نووسەرێکی یەجگار بە هێـزبوو . قسەکانی خۆی ، هەمووی دەخستە مێشکی گوێگرەوە . تا بەتەواوی تیا ئەچەسپاند. لەبابەت کاروباری جیهانیشەوە شارەزایی‌یەکی باشی هەبوو ، بە تایبەتی لەبابەت کوردەوە . هەموو دەم لە لایەن دۆستە کوردەکانیەوە هەواڵی کوردستانی بۆئەهات .

لە ناو دێیەکەدا [ مەلا محمود ] ناوێك هەبوو ، لە ووزە بەدەر ئایین داربوو . کەچی ئەمی لە هەموو کەس خۆشتر دەویست . هەردووکیان گەیشتبوونە پلەی ڕاستی پەرستی [ فەیلەسووفی ] .

ئێوارێ [ محمد علی ئەفەندی ] هاتە لامان . کەلێ قسەمان کرد . لە پاشـا چووینە [ قەلادێ ] ، کە چایخانەیەکی لێ بوو . کەوتبوە ڕۆژهەلاتی خوارووی پێنجوێنەوە . لە پاشا چووینە [ چوار باخ ]. باخێکی یەجگار ئاودارو فێنك بوو . لەسەر ئەستێرکەکەی دەس و دەم و چاومان شت . ئاومان خواردەوە . ئاروو و سـێوو ترۆزی‌مان خستە ناو ئاوەکەوە ، وەك تەرزەی لێ‌هات ، ئنجا دەستمان کرد بە خواردنیان . بێ‌تۆ ناخۆش یەجگار خۆش بوو . پاشان بە ناو ئەو هەموو دارو درەختەدا ، ڕێکامان ، بڕی . کاتێکمان زانی بانگی شێوانی دا . چووینەوە ماڵێ .

## پێنجوین
١٩٣٠/٧/٢٨

ئەو شەو، بە دڵێکی خۆشەوە نوستم ، چونکە لەگەڵ ئێمەیشدا ، لە خانووەکەدا ، [ مصطفی ئەفەندی ] ناوێك دانیشتبوو ، بەبرای بوێژی بەناوبانـگ [ زێوەر ئەفەندی ] دەرچوو . ئەو لە ئێمە زۆرتر حەزی لە بەزم و ڕەزمو زەماوەند ئەکرد . هەر یەکەم شەومان بە بێ دەنگی ڕابوارد . ئیتر لەو شەوە بە دواوە بە گۆرانی و بەستەو قسەی پێکەنینەوە ڕامان ئەبوارد . لە بەیانیدا خەبەرم بووەوە . بەڵام هێشتا هەتاو بە تەواوەتی نەکەوتبوو . کە سەرم بەرز کردەوە ، شـاخە ڕەنگینەکەی [ احمد هاجەر ] م هاتە پێش چاو ، کە بە تارایەکی ئەتلەسیین سەرپۆش کرابوو . بای بەری بەیان بەوفێنکییەوە ، کە هەیبوو ، دەهات بە سەرما و قژمی پەخشان ئەکرد ، هەر بەو چەشنەیش لە اق و کەڵای چنارە باڵا بەرزەکانو ، شۆڕەبییەکانی ئەدا دەی لەراندەوەو ، شنەی پێ ئەکردن و ، باوەشـێنی دێیەکەیشی پێ ئەکردن . لە ناو قەدی کێوەکەیشەوە ئەو ئاوە سـەهۆڵاوییە بە تافە تاف ، بەسەر بەردی شاخەکەدا ، دەهاتە خوارەوە . کە ئەیدا لە بەردەکان ، هاژە هاژی دەکردو، بەو هاژەیە پیاوی خەبەر ئەکردەوە . ئەمە لە وێ بوەستێ . لەم لایشەوە کەڵەشێرەکان بەسەر بانە بەرزەکانی پێنجوینەوە ئەیان قووقاند . لەلایەکی تریشەوە لە بۆڕە بۆڕی مانگاو ، لە بارە باری مەڕان و ، لە قۆڕە قۆڕی کاجووت ، گوێی پیاو کەڕ دەبوو ، هەر دەتکوت ، خۆشخواني [ شعر ] یە بەهارییەکەی

[ حاجی قادری کۆیی ] یەو پەردە بە پەردە بەبەر چەستەیی دووبارە ئەبێتەوە . کە ئەمانەم دی ، نە گرانی لە لەشماماو ، نەخەوالۆویی لە ناوچاوما ما . خۆم نەگرت ، بۆ ئەمەی سەیری دەشتی [ قزلجە ] و هەڵهاتنی تەواوی ڕۆژی پرشنگدار بکەم ، بە گورجی جلەکانم لەبەر کرد . [ نوری ئەفەندی ] یشم لەگەڵ هات . هێواش نەڕۆییشتیین . خۆمان پێ نەگیرا ، هەر بە هەڕاکردن چووین تا خۆمان گەیاندە تافاوەکە . تێر دەستمان تیاڕاکرت . بەو چاوئەندازو دەشتە ڕەنگینانەی کە خوا بە کوردی بەخشییوە تەواو دڵی خۆمان خۆش کردو ، چاوی خۆمان گەشاندەوە .

× × ×

ئێوارەیش چووینە هەواری لەشکری عیراق ، لای [علی ئەفەندی] چاو ئەندازێکی جوانمان هاتە پێش چاو .. چادرە سپییەکان بوو بوونە نەخش بە ڕووی شاخ ودەشتە سەوزەکەوە . تا ئێوارێ لەوێ بووین . گەڕاینەوە . لە ڕێ باسی بەخشندەیی یەزدانمان ئەکرد کەچیی داوە بە کورد . کاتێ کە بەسەر گردەکەدا هەڵئەکشاین ، [ علی ئەفەندی ] ، بنجە گیایەکی پیشـان دام [ گەوون ] یان پێ ئەگوت . چڵەکانیان بڕییبوو . هێشتا نەبوو بوو بە دوو ڕۆژ کە لە جێگـا بڕیینەکەیەوە [ گەتیرە ] ی دەرکردبوو . ئەمیش ئەو بەرهەمەیە کە [ کوردستان ] بە هەموو شوێنێکی ئەفرۆشێ . زۆر لە دانیشتوانی [ پێنجوێین ] بە فرۆشتنی ئەم گیایەوە دەژیێن و گوزەران دەکەن .

